I 1

# وەهمی سەرکەوتن

## (مانای سەرکەوتن لە ئێستادا)



عەلی ئەحمەد

# وەهمی سەرکەوتن

(پەڕتووکی یەکەم لە زنجیرەی: چەند پرسێکی گرینگی سەردەم)

---

نووسەر : عەلی ئەحمەد

دیزاینی بەرگ : عبدالله ساڵح

بابەت : فیکری

ساڵی چاپ : ٢٠٢٣ – یەکەم

---

# پێشکەش

* پێشکەشـــــــــــــە بــــــــــە هـــــــــــەموو بازنـــــــــــە مەعریفی،فەلسەفی،زانستی،عیرفانییەکانی کورد-زمان.

# سوپاس و پێزانین

* بۆ هەموو ئەوانەی لە چاپکردن و ڕێکخستنەوە و پێشنیارەکانی ئەم کتێبەدا بەشدار بوون.

# ناوەڕۆک

**دەروازە**

سـەرکەوتن لـە ئێسـتادا مشـتومڕێکی زۆری لەسـەرە. — وە باسـێکی سـەرەکییە لـە ژیـانی تاکێکـدا. بەتایبـەتی لـەناو پانتاییـەکانی پەرەپێـدانی مـرۆیی و بازنـە کـارگێڕی و بازرگانییەکاندا ...

بەڵام مەرج نییە سـەرکەوتن هـەر ئـەوە بێت کـە ئاشـناین پـێی. چونکـە مانـای سـەرکەوتن لـە ئێسـتادا دووچـاری گۆڕانکارییـەکی تـەواو ڕیشـەیی بووەتـەوە. وە ئـەوەی ناسەرکەوتووە بووە بە سەرکەوتوو. بەها ڕیشەییەکان پێچەوانە بوونەتەوە و گۆڕدراون.

وەهمی سـەرکەوتن دەکـرێت ببێتـە هـۆی نـەبوونی هاوسـۆزی و تێگەیشـتن بـۆ ئـەو کەسـانەی کـە لەگـەڵ قـاڵبی تەقلیدیی سەرکەوتندا نـاگونجێن. وەک ئەوانـەی کـە لەگـەڵ کێشـە

دەروونی یـان تەندرووسـتییە جەسـتەییەکان، یـان ئەوانـەی لـە پاشـــخانی بێبـــەش و نـــەگونجاوەوە دێن ... هـــەروەها وەهمی سـەرکەوتن، دەتـوانێت بەشـداربێت لـە هەسـتکردن بـە مـاف و خۆبەزلزانین، کە مرۆڤان پێیان وایـە کـە لـە بنەڕەتدا لـە کەسـانی دیکە باڵاترن تەنها لەبەر ئـەوەی سـەرکەوتنیان بەدەسـتهێناوە لـە بوارێکدا ...

گرنگە دان بەوەدا بنێین کە سەرکەوتن لەخۆیدا کۆتایی و ئامـانجێکی تـەواوەتی نییـە. بـەڵکو ئامرازێکـە لـەبۆ کۆمـەڵێک ئامانجی دیکە. سەرکەوتنی ڕاستەقینە دەبێت نەک تەنها بە بابەت و دەسـتکەوتی دەرەکییـەوە ببەسـترێتەوە، بـەڵکوو دەشـێت بـە گەشـــەکردنی تاکەکەســـێک و جێبـــەجێکردنی ئەرکـــەکان و بەختەوەربوونیش بپێورێت. پێویستە سـەرکەوتن وەک چـەمکێکی گشـتگیر سـەیر بکـرێت کـە تیایـدا هـەموو بوارەکـانی ژیـان دەگرێتەوە. لەوانـەش پەیوەندییـە کۆمەڵایەتییـەکان، تەندرووسـتی

و گەشەسەندنی خودی تاکێک.

لە کۆتاییدا، وەهمیی سەرکەوتن باوەڕێکی مەترسیدار و چەواشەکارانەیە. کە سەرکەوتن لەگەڵ بەدەستکەوتووە دەرەکییەکان هاومانا دەکاتەوە. زۆرجار لەسەر حیسابی لایەنە گرنگەکانی دیکەی ژیان، سەرکەوتن بەکار دەهێندرێت. وە گرینگە دان بەوەدا بنێین کە سەرکەوتنی ڕاستەقینە چەمکێکی گشتگیرە کە هەموو بوارەکانی دیکەی ژیان دەگرێتەوە و، بەدواداچوون لەبۆ سەرکەوتن دەبێت هاوسەنگ بێت لەگەڵ گرنگیدان بە گەشەکردنی خود و، هەوڵدان بۆ دەستەبەرکردنی بەختەوەری لە ژیانێکدا.

هەوڵ مەدە ببیت بە پیاوێکی سەرکەوتوو. بەڵکوو ببە بە پیاوێکی بەنرخ.

- ئەلبێرت ئاینشتاین

## سەرکەوتن لە ئێستادا مانای چییە؟

کەلتووری سەرکەوتن [١] [Grind/Husstle Culture] لــە هــەر ســەردەمێکدا مانــای خــۆی هــەبووە. ئــەم مانایــەش پەیوەســت بــووە بــەو بــەها باوانــەی کــە لــەناو ســەردەمەکەدا گەشەیان کردووە و دەرکەوتوون.

دوور نــەڕۆین، دە ســاڵ پێش ئێســتا مانــای ســەرکەوتن جیــاواز بــووە لــە مانــای ســەرکەوتن لــە ئێســتادا. ئەگــەرچی لــە ڕابــردوودا زاراوەی ســەرکەوتن بــۆ ســەر چەنــدین پلەوپێگــەی کۆمەڵایــەتی بــەکار هــاتووە، بــەڵام ئــەم زاراوەیــە لــە ئێســتادا بەرتەســک بووەتــەوە بــۆ ســەر بەشــێکی کــەمی پیشــە و پێگــە کۆمەڵایەتییەکان.

وە پرسـی سـەرەکی لـە ئێسـتادا، ئەوەیـە کـە لـە ڕاسـتیدا زاراوەی سەرکەوتن مانای خۆی لەدەست داوە. یاخود پاراوتر

بیڵـێین: ئـەم زاراوەیـە دراوەتـە پـاڵ کۆمـەڵێک پیشـە و پێگـەی کۆمەڵایەتی، کە لـە ڕابردوودا هیچ بایـەخێکیان پێ نـەدراوە و بـە نیمچـە-سـەرکەوتووش هـەژمار نـەکراون. وە تەنانـەت بـە خوێندنەوەیەکی لۆژیکییانە و بابەتییانەش، خاوەنی هیچ بەهایەک نین کە پەیوەست بێت بە مانا باوەکەی چەمکی سەرکەوتنەوە.

ئـەم گۆڕانکارییـە ڕیشـەییە لـە مانـای سـەرکەوتندا، دەرئـەنجامی گـۆڕانی کۆمـەڵێک بـەهای بـاوی کۆمەڵگایـە. لـێرەدا ئێمـە کـار لەسـەر ئـەم بەهایانـە ناکـەین، بـەڵکوو هـەوڵ دەدەین دەرکەوتەکانی گۆڕانی مانای سەرکەوتن ئاشنای خوێنەر بکـەین. (لـە سـەدەی بیسـت و نـۆزدەدا سـەرکەوتن خـاوەنی مـۆرکێکی نـاخودی و کۆمەڵایـەتی بـووە. بـەڵام لـەدوای سـەدەی بیسـت و یەکدا، سەرکەوتن خاوەنی مۆرکێکی خودییە. ئەم گۆڕانکارییە لـە بەهاکاندا، بەشێکی دەرکەوتنی گۆڕانکارییەکانە لە مانـای چـەمکی سەرکەوتندا ... )



سەرکەوتن چیدیکە ئەوە نییە کە بیری لێ دەکەینەوە.

ئەمڕۆ دوو تاک؛ دانەیەکیان بازرگانی بە جەستەی خۆی دەکات لە سەرهێڵ [٢] [Onlyfans] و دانەیەکیان ڕاپ دەڵێت [٣] [Rapper]، خۆیان بە بەشێک لەو تەوژمە دادەنێن کە بە هەوڵدان و سەرکەوتن ناسراوە [٤] [Make It Culture]. ئەمە بەو واتایە دێت؛ لە ڕاستیدا دۆخێکی وەها ڕەخساوە تیایدا بۆشاییەک دەرکەوتووە و پڕ دەکرێتەوە بە هۆی ئەم بەرهەمانەی کە لە سەرەوە باسمان کرد (بازرگانیکردن بە

جەستە و ڕاپ-بێژی). وە پڕکردنەوەی ئەم بۆشاییە نەرێنییانە، بە سەرکەوتن داندراون.

بەشێکی دیکەی سەرکەوتنەکانمان بریتین لە: ئالوودەبوونی کارکردن [٥] [Workaholism] و کارکردنە بێماناکان [٦] [Useless Jobs]، ئەم دوو دەرکەوتەیە، دوو نەخۆشیی دەروونی ڕاستەقینەن و بوونێکی واقیعییان هەیە. لە ئێستادا ئەم دوو نەخۆشییە دەروونییە بوون بە بنەمایەکی سەرەکی لە کەلتوور و گوتارەکانی مانا باوەکانی سەرکەوتندا. سەیر نییە بەشێکی زۆری ئەو پیشانەی کە بە سەرکەوتوو ناسراون، خۆیان لەناو یەک لەم دوو پانتاییە دەبیننەوە. ١. یان ئەوەتا کارەکە ئەوەندە بێمانایە کە هیچ بەرهەمێکی ئەرێنی دەستەبەر ناکات بۆ خودی تاک و کۆمەڵگا. ٢. یان ئەوەتا

کەرەکە ماندووکەرانەیە و دووبارە، هیچ بەرهەمێکی ئەرێنی دەستەبەر ناکات بۆ خودی تاک و کۆمەڵگا.




کەواتا، ئایە ناشێت تێڕوانینمان بۆ سەرکەوتن هەڵە بێت؟

... بەتایبەتتر ئەم تێڕوانینەی لە ئێستادا چەقی گرتووە. ئایە سەرکەوتن مانای چییە؟ ...

تاکـەکانی کۆمـەڵگا بـیر لـە مانـای سـەرکەوتن ناکەنـەوە، بـەڵام هـەوڵ دەدەن لـەناو سـەرکەوتندا بمێننـەوە. لـێرەدا پرسـە سـەرەکییەکە ئەمەیە: ئایە سـەرکەوتن لـە ئێسـتادا بـە مانـای چی دێت بۆ تاکەکان و کۆمەڵگایەک؟ ... دوور نارۆین ئەگەر بڵێین لە ئێستادا ئەم زاراوەیە بە مانـای تێکدان و ڕووخانـدن دێت. لەبـەر ئەوەی بەشێکی زۆری ئەو سەرکەوتنانەی کە لەلایەن کۆمەڵگا و تاکەکانـــەوە بـــە ســـەرکەوتوو دانـــدراوە، لـــە ڕاســـتیدا میکانیزمێکـە/پەیڕەوێکـە کـار لەسـەر سـەرنەکەوتن و دۆڕان و کەوتن دەکـات نـەوەکوو خـودی چـەمکی سـەرکەوتن. چونکـە بۆ ئـەوەی تاکێـک بگـات بـەوەی کـە دەیـەوێت [٧] [Make It No Matter What]، ئـەوا دەبێت ئـەم تاکـە هـەموو شـتێک بکاتـە قوربـــانی: تەندرووســـتی جەســـتە و دەروونی، پەیوەندییـــە کۆمەڵایـەتی و خێزانییـەکان و ناوچـە ژینگەییـەکان و، چەنـدین قوربانیـدانی دیکـە. چونکـە خـودی سـەرکەوتن لـە ئێسـتادا لـە

ئەنجامی باجدانە. سەرکەوتن یەکسانە بە: باجدانی خود. یاخود باجدان و قوربانیدانی ئەوانی دیکە. لە هەمان کاتیشدا، دەبێت ئەوانی دیکە بدۆڕێن؛ بۆ ئەوەی خۆت سەرکەوتوو بیت. بەشێکی زۆری پیشە و پلەوپێگەکانی کۆمەڵگا خاوەنی ئەم چوارچێوە ماکیاڤێلییانەیەن.

بۆوێنە: بازرگانەکانی جەستە "سەردەکەون" لە ئەنجامی دۆڕاندن و باجدانی تاکەکانی دیکە. بازرگانەکانی جەستە، خودی جەستەکەیان دەکەن بە کاڵایەک و بەکاربەرانیش دەیکڕنەوە. لەم چوارچێوە ئابوورییەدا؛ هەمیشە بەکاربەرەکان دەدۆڕێن. چونکە ئەوان {١. داهات + ٢. کات + ٣. سەرنج} لەدەست دەدەن. بەڵام هەمیشە بازرگانەکان ''سەردەکەون'' چونکە ئەوان {١. داهات + ٢. کات + ٣. سەرنج} بەدەست دەهێنن.

بەشێکی زۆری ڕاپ-بێژەکانیش بە هەمان شێوە وان. ئەوان وێنەدانەوەیەکی ساختە دەبەخشنەوە بە گوێگرەکانیان و،

ژیانێکی ساختە دەبەخشنەوە پێیان، کە لە ڕاستیدا خۆشیان ئاوا نـــــــاژین. ڕاپ-بێژەکـــــــان {١. وزە ٢. پەیوەندیـــــــداربوون/ Relatability [٨] } دەبەخشن بە کڕیارەکانیان و، ئەمانیش {١. داهـات ٢. سـەرنج} دەبەخشـنەوە بـە بەرهـەم-هێنـەرەکان. لـەم چوارچێوەیـــەدا گوێگرەکـــان هەمیشـــە دەدۆڕێن بـــە هـــۆی هەرسکردنی کاڵای ساختەوە.

لـــێرەدا ئـــەم یاســـایە نـــەک تـــەنها لـــەم دوو بـــوارەدا بەرجەستەیە. بەڵکوو بەشێکی زۆری پیشەکانی سەردەم، لەسـەر ئـەم بنەمایـە کـار دەکـەن. وە تەنانـەت، بەشـێکی زۆری بوارەکـان دەڕووخێن و هەرەس دەهێنن ئەگەر ئەم بنەمایە بەکار نەهێنن و خۆیان لەسەر ئەم بنەمایەدا دەهێڵنەوە.

ئەم پەیڕەوە (مۆدێل) ئابوورییـەی سـەرکەوتن؛ کـە تیایـدا دەبێت باجێـک بـدرێت لـە ئـەنجامی سـەرکەوتندا، لـەناو هـەموو پێگەکانی ژیانماندا ڕەنگی داوەتەوە. بەڵام ئایە دەشێت ژیان ئـاوا

بێت؟ ... لە ڕاستیدا نەخێر. چونکە تەنانەت تـەواوی سیسـتەمەکە تاو دەدات بەرەو دۆڕاندن ئەگەر بەردەوام بێت. واتـا لـە ڕاسـتیدا خـودی ئـەم مۆدێلـە هـەر لـە سـەرەتاوە ڕێـڕەوی پـەیڕەوەکانی بەرەو دۆڕاندن ئاڕاستە کراون.

ئـەم جۆرە مۆدێلـەی سـەرکەوتن، کـار لەسـەر دۆڕانـدنی <ئــەوانی دیکــە> دەکــات. ئایــە ســەرکەوتن، هــەر بەڕاســتی ســەرکەوتنە لەگــەر لــە ئــەنجامی دۆڕانــدن و کــەوتنی <ئــەوانی دیکــە>دا بێت؟ ... ئەوانــەی بازرگــانی بــە جەســتەی خۆیانــەوە دەکــەن، ســەرنجدانەکانی ئــەوانی دیکــە بەدەســت دەهێنن، ئــەم سەرنجدانانە لە ڕووی مادییەوە [پارە] و لە ڕووی مەعنەوییـەوە [ناوبانــگ]ــە. بــەڵام بــۆ بەکاربــەرەکان هەمیشــە بەرهەمەکــە دەرکەوتەیـەکی نـەرێنی دەبێت. چونکـە ئـەم بەرهەمانـە لەسـەر

پەیڕەوێکی دوورمەودا ڕێک نەخراون و هەر تەنها <کاتی>ن [کالای چارەسەری کاتی/چێژی کاتی].

ئەگەرچی خوێندنەوەیەکی {ئەخلاقی/ویژدانی/ئاکاری} بۆ دۆخەکە گرینگە، بەلام بێجگە لە خوێندنەوەیەکی ئەخلاقی و ئاکاری بۆ دۆخەکە، تەنانەت ئەگەر بە جیهانبینینێکی {سوودگەرایی/چێژگەرایی/بەرژەوەندگەرایی} ڕەچاوی دۆخەکە بکەین، ئەوا دووبارە دەبینین کە دۆخەکە نەرێنییە و لە دژی ئەم سێ بەهایەیە. چونکە خودی بەرهەمەکە ناتوانێت ئەم سێ پانتاییە : {١. سوودگەرایی. ٢. چێژگەرایی. ٣. بەرژەوەندگەرایی}. پڕ بکاتەوە. چونکە خودی بەرهەمەکە بۆ ئەم سێ پانتاییە ئاکارییە دەستەبەر نەکراوە. بەڵکوو بۆ سەرنەکەوتن و نائاکارییەت، دەستەبەر کراوە. ئەم بەها ئاکارییانە کار لەسەر دەستەبەرکردنی مۆدێلێکی ئاکاری و ئەخلاقی دەکەن. بەلام بەرهەمەکان لەسەر ئەم بنەما ئاکارییانە دانەندراون [بەرهەمێکی

ئــەنتی-ئاکــاری ناتوانــدرێت بــە خــودی بنــەما ئاکارییــەکان لێکدانەوەی بۆ بکرێت].

لــێرەدا دەمــەوێت ئــەم پرســە بــورووژێنم: ئایــە هــەر بەڕاســتی بازرگــانیکردن بــە ئەندامــەکانی جەســتە و، پیشــە ناپێویستەکانی کۆمەڵێک بواری نەرێنی دیکە، سەرکەوتنە؟ ...

بەشـێکی زۆری گوتارەکـانی نـاو کـەلتووری سـەرکەوتن، کار لەسەر ئەوە دەکەن کە چۆن زۆرترین پانتایی داگیر بکـەیت. وە دەبێت <ئەوانی دیکە> بدۆڕێن و بەکاریان بهێنیت بۆ ئـەوەی بگـەیت بـەوەی کـە دەتـەوێت. لـێرەدا تـەنها پێشـە گرینگـە نـەک ئەوەی کە دەبێت ببین.




ئەو تاکەی کە بازرگانی بە جەستەی خۆی دەکات و داهاتێکی چاکی هەیە، سەرکەوتووە لە بوارەکەی خۆیدا. بەڵام دۆڕانە بۆ بەکاربەرەکان. کەواتا لێرەدا جەمسەری ئاڕاستەکردنی بەرهەمەکە هەر لە سەرەتاوە نەرێنی بووە. بەڵام کۆمەڵێک بەهای کۆمەڵایەتی باو؛ ئەم هەڵەیان ڕەخساندووە هەتاوەکوو جەمسەری ئاڕاستەکردنی بەرهەمەکە ئامانجی خۆی بپێکێت. بەشێکی زۆری بەکاربەرەکان ئاگامەند نین بەوەی کە چی

لەدەست دەدەن لە کاتی کڕینی بەرهەمێکدا. بەشێکی زۆری ئەو بەرهەمانەی کە بە "بەلاش" و "بەخۆڕایی" ناسراون، لە ڕاستیدا وا نین. وە هەمیشە بەکاربەر بە شێوازێکی دیکە پارەکەی دەبەخشێتەوە.

بەشێکی زۆری ئەو چالاکییانەی کە بە سەرکەوتوو ناسراون، بوونەتە هۆکاری زیانگەیاندنی ڕیشەیی بە مرۆڤ و ژینگەکەی. وە تەنانەت بوون بە هۆکاری سەرنەکەوتنیش بە مانا باوەکەی. گوتاری کەلتووری سەرکەوتن لە ئێستادا ئەمەیە: ئەبێ سەرکەوین بە هەر جۆریک بێت! ڕێڕەوەکە گرینگ نییە، بەڵکوو ئامانجەکە گرینگە! ... ئەم دەستەواژەیە مانای ئەوەیە کە دەبێت بەشێک و تەنانەت زۆرێک، بدۆڕێن. چونکە سەرکەوتنەکانمان پەیوەستە بە دۆرانی ئەوانی دیکەوە.

لـێرەدا بــە پێویســتی دەزانم چەنــد مــۆدێلێکی گــرینگی سـەرکەوتن بـەراورد بکـەم و تیشـکیان بخـەمـە سـەر. بۆ ئـەوەی خوێنەر بە تاکی سەرکەوتوو ئاشنا بێت:

١. مۆدێلی دکتۆر وەکوو کەسایەتییەکی سەرکەوتوو:

پیشەی دکتۆر هەمیشە بە پیشەیەکی گرینگ ناسـراوە لـە تــەواوی کۆمــەڵگا و ســەردەمە مێژووییەکانـدا. بــەڵام لەبــەرچی ئاوایە؟ ... چونکە لە ڕاستیدا <دکتۆر> پیشەیەکە لەسەر بنـەمای چاکبوونــەوە بونیــاد نــراوە. واتــا پیشــەی دکتــۆر، پیشــەیەکی ئاکارییەوە بە پلە یەک. وە هەموو کاتێک پیشـەی دکتـۆر وەکـوو بەرهــەمێک؛ دەرکەوتــەکانی ئــەرێنیٚ دەبن. ئەگــەرچی ڕەنگــە بەشـێکی زۆری چارەســەرەکانیش ســەرنەگرێت، بــەڵام خـودی ئاڕاســتەکردنەکە خــاوەنی بـزەوتێکی ئـەرێنی و ڕووحی بـووە. لێرەدا نـەخۆش (بەکاربـەر) هیچ لەدەست نـادات و چارەسـەریش

دەکرێت. وە دکتۆر (بەرهەمهێن/بەرهەم) ئەوە بەدەست دەهێنێت کە چارەسەری کردووە. لەم بوارەدا هەم خۆشەویستی درووست دەبێت و هەمیش پلەی کۆمەڵایەتی دکتۆرەکە بەرز دەبێتەوە و دکتۆرەکە دڵخۆشە بە چارەسەرکردنی نەخۆشەکەی و وەکوو بەرهەم و منداڵی خۆی ڕەچاوی دەکات.



لـێرەدا دکتۆرەکـە چارەسـەرکردن وەکـوو دەسـتکەوت و بەدەستهێندراوێک دەبینێت، کـە لـە ئەنجامـدا بەختـەوەری دەکات. وە نەخۆشەکەش چارەسەر دەکرێت و ئەمیش بەختـەوەر دەبێت. لـێرەدا سـەرکەوتن لـە هـەردوو لاوە ئـەرێنی بـووە و بـووە بـە سـەرکەوتنێکی پـەتی. لـەلای دکتۆرەکـە، چارەسـەرکردنی نەخۆشـەکە و خـودی ئـەم پڕۆسێسـە، بریتییـە لـە دەسـتکەوت [و پـارە]. نـەوەکوو وەرگرتـنی قـازانجی مـاددی. [لـێرەدا ئێمـە مەبەسـتمان لـە دکتـۆرە بـە مانـە سـادەکەی. ڕاسـتە مـەرج نییـە هـەموو دکتۆرێـک و پیشـەیەکی دکتـۆری ئـاوا بێت، بـەڵام خـودی پیشەکە لەسەر بنەمای بەهای چاک بوونیاد نراوە.]

مـۆدێلێکی دیکـەی سـەرکەوتن بریتییـە لـە چـاودێر (سەرکردە) :

٢. مۆدێلی چاودێر وەکوو کەسایەتییەکی سەرکەوتوو:

چاودێر بریتییە لە بەڕێوەبەر و سەرکردە و ئەو تاکەی کە دەتوانێت کۆمەڵێک تاکی دیکە ڕێک بخات. ئەم ئەرکە سەرکەوتووە. چونکە لە هەردوو لاوە دەرکەوتەی ئەرێنی بەرپا دەکات. لێرەدا چاودێر (ڕێکخەر) هەوڵ دەدات کێشەکان چارەسەر بکات و تاکەکان لەسەر سکەی خۆیان ڕابگرێت. وە ئەمەش دڵی ئەو خۆش دەکات بەوەی کەوا ئەو توانیویەتی بەرپرسیاریەتی خۆی بە ئەنجام بگەیەنێت. وە هەمیش تاکەکانی دیکە سوود و چاکە وەردەگرن لەم کردارە.

مۆدێلێکی دیکەی سەرکەوتوو بریتییە لە کاری-خۆبەشی:

٣. مۆدێلی خۆبەخشی وەکوو کەسایەتییەکی سەرکەوتوو:

لە ڕاستیدا، بەشێکی زۆری ئەو کردانەی بە <چاکە> ناسراون؛ لەسەر بنەمایەکی خۆبەخشانە بونیاد نراو. وەکوو خێرکردن و هاریکاریکردن و بەخشین و ... ئەمانە هەموو

لەسەر ئەو یاسایە داندراون کە نابێت و مەرج نییە خۆبەخش قازانج وەربگرێتەوە لە پای بەخشینەکەیدا. بە نزیکەیی لە ئێستادا هەموو پیشەکان کار لەسەر قازانج دەکەن. بەڵام پیشەی خۆبەخشی، کار لەسەر گەڕاندنەوەی قازانج ناکات. بەڵام زۆرجار پیشەوەرێکیش دەتوانێت ببێت بە خۆبەخش ئەگەر لە ساتێکی جیاوازدا بەرهەمەکەی بە خۆبەخشانە پێشکەش بکات. کە ئەمەش بە گوێرەی کات و شوێنی خوازراو دەبێت.



لێرەدا ئێمە باسی چەند مۆدێلێکی سادەی سەرکەوتنمان کرد. هۆکاری سەرەکی بەسەرکەوتوودانانی ئەم مۆدێلانە، بریتییە لەوەی کە لە ڕاستیدا ئەم مۆدێلانە کار لەسەر بەرژەوەندی خودی و ویستی خودی ناکەن. بەڵکوو هەمیشە ئاڕاستەکانیان بۆ دەرەوەی خۆیانە و دەیانەوێت گۆڕانکاری لە دەرەوەی خۆیان درووست بکەن. وە کار لەسەر بەدۆڕاندان و دۆڕاندنی <ئەوانی دیکە> ناکەن. بەڵکوو لە ڕاستیدا بەپێچەوانەوە، مانەوە و پابەندبوونی ئەم پیشە سەرکەوتووانە، لەسەر سەرکەوتووبوونی <ئەوانی دیکە> وەستاوەتەوە. بۆ ئەوەی خودی پیشەکە بە سەرکەوتوو دابندرێت دەبێت <ئەوانی دیکە>ش سەر بخات.

بەڵام ئەگەر ئێمە مۆدێلێکی ناسەرکەوتوو بەراورد بکەین، ئەوا دەبینین دۆخەکە تەواو پێچەوانەیە. بەشێکی زۆری مۆدێلە ناسەرکەوتووەکان لە ناو پانتایی {شادیهێن و جەو و

خۆشی-دەربڕین}دان [Entertainment] [٩] . وە کار لەسەر بەرژەوەندیی خودی دەکەن. بەڵام بۆ مرۆڤی سەرکەوتووی پەتی، خودی پیشە ئەرێنییەکەی شادیهێنە و، بەدوورە لە بەرژەوەندی خودی.

بۆوێنە: مۆدێلی ڕاپ-بێژی لە بواری نەرێنیدا، هەڵدەستێت بە فرۆشتنەوەی چەندین دەقی نەرێنی کە کار لەسەر تەشەنەکردنی {ڕق و تۆڵە و جەنگ} دەکەن. وە وەرگرەکانی ئەم بەرهەمەش، هەمان {ڕق و تۆڵە و جەنگ} وەردەگرنەوە و سووڕێکی نەرێنی پێک دێت. بەڵام لە هەمان کاتدا ئەم ڕاپ-بێژانە خۆیان بە سەرکەوتوو هەژمار دەکەن چونکە لە ڕووی داهاتەوە سەرکەوتوو بوون. بەڵام ئەم داهاتە لە ئەنجامی کەوتنەوەی ڕێژەیەکی بەرزی قوربانییە.

ئەم جۆرە مۆدێلە کۆمەڵایەتییانەی کە کار لەسەر سەرکەوتوویی ساختە دەکەن، هەمیشە <ئەوانی دیکە> دەخەنە

ژێر بارێکی نەرێنییەوە. لەبەر ئەوە، ناکرێت بە سەرکەوتوو هەژمار بکرێن.

سەرکەوتنی ساختە خاوەنی لۆژیکێکی بەپێزە. کە بەم شێوازەیە:

١. من دەبێت سەر بکەوم، گرینگ نییە <ئەوانی دیکە> چییان لێ بەسەر دێت.

٢. من سەر دەکەوم، <ئەوانی دیکە> دەبنە قوربانی و زیان لێ کەوتوو.

بەڵام سەرکەوتنی ڕاستەقینە خاوەنی ئەم لۆژیکەیە:

١. من ئەو کاتە سەرکەوتووم کە زیان و قوربانیم بە <ئەوانی دیکە> نەگەیاندبێت و، ئەوانیش لەگەڵ مندا سەرکەوتوو ببن.

سەرکەوتنی ساختە خاوەنی لۆژیکێکی خودشکێنانەی تاکگەرایانە [لە باری نەرێنیدا]. بەڵام سەرکەوتنی ڕاستەقینە خاوەنی لۆژیکێکی کراوەترە لە خود و خۆپەرستانە نییە.

لە ئێستادا بەشێکی زۆری ئەو پلەوپێگە و پیشە کۆمەڵایەتییانەی کە بە سەرکەوتن ناسراون، لە ڕاستیدا هەموو شتێکن تەنها سەرکەوتن نەبێت. سەرکەوتنی ساختەن. تا کاتێکی سنووردار سەرکەوتوون. جگە لەوەش زیانیان هەیە و دەورووبەر دەخەنە مەترسییەوە.

کردەوە گەورەکان لە کردەوەی بچووکتر پێک هاتوون.

- لاوۆ تسو (Lao Tzu)

## تاقیکردنەوەیەکی فیکری

لـێرەدا بـە پێویسـتی دەزانم  تاقیکردنەوەیـەکی فیکـری ئاشـنای خوێنەر بکەم:

مەزنـدە بکـە هـەموو تاکێـک سـەرکەوتوو دەبێت. هـەموو دەبن بە خاوەن کۆمپانیا و بەرهـەمهێن. وە هـەموو داهـاتی بـەرز بەدەسـت دەهێنن. لـێرەدا ئێمـە کۆمەڵگایـەکی بەرهـەمهێنمان پێـک هێناوە کە لە ئاسـتێکی بـەرزی سـەرڕێژی ناپێویسـتدایە. جگـە لـە بـەرخۆری، دەبێت مەزنـدەی ئـەوەش بکـەین کـە بەرهـەمهێنان لـە ئاسـتێکی بـەرزدا، دەبێتـە هۆکـاری لێکەوتنـەوەی زیـان. کـەواتا؛ مەرج نییە هـەمووومان بەرهـەمهێن بین بـەو مانـا بـاوەی کـە بـەها سەپێندراوەکانی کۆمەڵگایەک و سـەردەمێک وا وێنای سەرکەوتن دەکات.

خـودی چـەمکی سـەرکەوتن لـە ئێسـتادا بـەرەو ئـەم ئاڕاسـتەیەمان دەبات کـە تیشـکمان خسـتە سـەر ... لەبـەر ئـەوە، سـەیر نـابێت ئەگـەر ڕۆژێـک دابێت تـەواوی مرۆڤایـەتی بـە هـۆی سەرکەوتووبوونەکانییەوە هەرەس بهێنێت و لەناو بچێت.



ئێمـە ئـەوەین کـە بـەردەوام دەیکـەین. کـەواتا، نایـاببوون کردەوە نییە بەڵکوو خووە.

– ئەرستۆ

## سەرکەوتن لە کوردستاندا واتای چییە؟



ئەگەر لە تاکەکانی کورد بپرسین ئایە سەرکەوتن بە واتای چی دیت؟ ... بێشک وەڵامی جیاوازمان بۆ دێت چونکە زاراوەی <سەرکەوتن> بووەتە بە پرسێکی ڕێژەگەراییانە لەناو کۆمەڵگاکاندا.

بـەڵام بێشـک، بەشـێکی زۆرمـان جـەخت لەسـەر ئـەوە دەکەینـــەوە کـــە ســـەرکەوتن بریتییـــە لـــە دەســـتەبەرکردنی <چاکەیەکی گشتی> و، <زیان-نەگەیاندن> بـە ئـەوانی دیکـە. وە لە ڕووی پیشەوەرییەوە، دەڵێین پێویستە ئەم کەسە لە ژیانیدا بە شێوازێک لە شێوازەکان: دەوڵەمەند ببێت.

لـە کوردسـتاندا، پیشـەی سـەرکەوتوو ئەوەیـە کـە دەبێت داهـاتێکی بـەرزی هـەبێت و، کـەمترین ماندووبوونیشـی تێدا بێت. لـێرەدا پرسـێک بـە نـاوی <خزمـەتکردن> بـوونی نییـە. تـەنها بەدەسـتهێنانی بەرژەوەندییـە تاکییـەکان بـوونی هەیـە. ئەگـەرچی ئەمە بووەتـە بـە بەهایـەکی بـاو لـە کۆمـەڵگای کوردیـدا، بـەڵام لـە نێـوان تاکەکانـدا، بـە تـەواوەتی باوەڕیـان بـەم بـەها بـاوە نییـە و، حـەز دەکـەن گیـانێکی خزمەتکارانـە بـوونی هـەبێت نـەوەکوو گیانێکی بەرژەوەندخوازانە.

هەموو تاکێکی کورد، حەز دەکات گیانێکی خزمەتدارانە بوونی هەبێت وەک لەوەی گیانێکی بەرژەوەندیخوازانە بەرپا بێت. چونکە بە هۆی ئەزموونی کۆمەڵگاکەمان، ڕوون بووەتەوە کە گیانێکی بەرژەوەندیخوازانە نامانگەیەنێت بە هیچ و نەیگەیاندین بە هیچ. کەواتا، پێویستە تاکەکانی کۆمەڵگا لەسەر بنەمای خزمەتکردن دووبارە پەروەردە بکەینەوە. ئەمەش لە شێوازی داڕێشتنەوەی قسەکردنەکانمانەوە دەبێت: پێویستە بە منداڵێک بڵێین لە داهاتوو حەز دەکەیت چۆن خزمەت بە مرۆڤەکان و ژیان بکەیت؟ ... نەک: حەز دەکەیت لە داهاتوو ببیت بە چی؟ ... چونکە هەروەکوو ڕوونە، بەشێکی زۆری کۆمەڵگا قاییل نین بەو داخوازییانەی کە منداڵەکە دەری دەبڕێت. وە ئەم داخوازییانە بەردەوام لە گۆڕاندان. بەڵام خزمەتکردنێکی میتافیزیکییانە، گۆڕانکاری تێدا نییە. چونکە تاکەکە خزمەت دەکات لە هەر پێگە و بوارێکدا بێت.

سەبارەت بە پیشەکان و چەندین بابەتی دیکە، کورد لە ئێستادا لەنێوان واقیع و حەقیقەتدایە. کە لێکدژییە. چونکە ئەو دەزانێت لە بنەڕەتدا ڕاست و درووست نییە ژیان ئاوا بێت. — کە ئەمەش هەڵوێستێکی حەقیقەتمەندانەیە. بەڵام لە هەمان کاتیشدا واقیع قبووڵ دەکات. کە ئەمەش هەڵوێستێکی نا-حەقیقەتمەندانەیە.

سەرکەوتن کلیلی بەختەوەری نییە. بەختەوەری کلیلی سەرکەوتنە.

- ئەلبێرت شوایزەر (Albert Schweitzer )

## دوا وته

بــەدواداچوون و هەوڵــدان لــەبۆ ســـەرکەوتن وەکــوو بابــەتێکی ئــەرێنی و خــوازراو لــە کۆمــەڵگای مــۆدێرن ڕەچــاو دەکرێت. بەڵام دانانی سەرکەوتن لەسەر هەموو شتێکی دیکـە لـە ژیاندا دەتوانێت کاریگەری نەرێنیی بـەرچاوی لەسـەر تاکـەکان و کۆمەڵگایەکدا هـەبێت. فشـاری سـەرکەوتن دەتـوانێت کاریگـەری نەرێنی لەسەر تەندروستی دەروونی و پەیوەندییەکان و ئـەخلاق درووسـت بکـات. گرنگـە بـۆ تاکـەکان کـە ئاشـنای کاریگەرییـە نەرێنییـەکانی دانـانی سـەرکەوتن بەسـەر هـەموو شـتێکدا بن و، هەوڵبدەن لەبۆ دەستەبەرکردنی هاوسـەنگی لـە ژیانیانـدا. وەکـوو جێگرەوەیەک بۆ سەرکەوتن بە فشار و بە زۆرەملێیانە.

لـه کۆمـەڵگا مۆدێرنـەکان زۆرجـار سـەرکەوتن وەکـوو ئامـانجی سـەرەکی ژیانێـک سـەیر دەکرێت، تاکـەکان بـە تونـدی کێـبڕکێ دەکـەن بـۆ بەدەسـتهێنانی سـەرکەوتن لـە پێگـە و پانتاییـەکی کۆمەڵایەتیـدا. بـەڵام بـەدواداچوونی بـەردەوام لـەبۆ سـەرکەوتن و ئـاڵوودەبوون پـێی، دەتـوانێت کاریگـەری نـەرێنی لەسـەر تاکـەکان و کۆمـەڵگا هـەبێت. دانـانی سـەرکەوتن بەسـەر هـەموو شـتێکدا لـە ژیانـدا دەتـوانێت ببێتـە هـۆی ئـەوەی کـە سەرنجێکی بەرتەسک لەسەر دەستکەوتەکانی ژیانێک دابنێت.

کاتێک سـەرکەوتن لـە سـەرووی هـەموو شـتێکی دیکـەوە دادەندرێت، ئـەوا بێشـک کاریگـەریی ناپێویسـت و نـەرێنی لەسـەر تەندرووسـتیی دەروونی کۆمـەڵگاکان درووسـت دەکـات. فشـاری سەرکەوتن دەکرێت ببێتە هۆی ئەوەی تاکەکان تووشی ئاستێکی بەرزی دڵەڕاوکێ و فشـاری دەروونی ببن. ئەمـەش دەبێتـە هـۆی خەمۆکی و بێتامبوونێکی قووڵ بەرامبەر بـە ژیـان. وە پێویسـتیی

هەوڵدانی بەردەوام بۆ سەرکەوتن دەکرێت ببێتە هۆی ئەوەی کە خولێکی بێکۆتایی کار و تەماحی لێ بکەوێتەوە. ئەمەش کاتێکی کەم دەستەبەر دەکات بۆ پشوودان یان بەشداریکردن لە چالاکییە کات بەسەربردنە ئەرێنییەکان. بێجگە لەوەش، ترس لە شکست دەتوانێت ببێتە هۆکاری سەرەکی هەوڵ نەدان و تاقینەکردنەوەی خەونەکانی تاکێک. چونکە ئەم تاکە هەر لەسەر پێوەری سەرکەوتندا دەڕوات و هەر شکستێک کە تووشی بێت، بە دۆڕانی ڕەها لەقەڵەمی دەدات. کە ئەمەش لە ئەنجامی بەبەرزڕاگرتنی بەهای سەرکەوتنە.

بەرزڕاگرتنی سەرکەوتن بەسەر هەموو شتێکی دیکەدا دەتوانێت کاریگەری نەرێنی لەسەر پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان دروست بکات. گرینگیدان بە دەستکەوتنی ماددی، وا لە تاک دەکات کە  ببێتە هۆی ئەوەی تاکەکان پەیوەندییە مرۆییەکان پشتگوێ بخات. ئەمەش دەبێتە هۆی هەستکردن بە تەنیایی و

گۆشەگیری. جگە لەوەش، ڕەنگە تاکەکان تووشـی  ڕکابەرییـەکی چـڕ ببنـەوە و ئـەوانی دیکـە وەکـوو بەربەسـتێک لەبـەردەم سەرکەوتنەکانیاندا لەقەڵەم بدەن. ئەمـەش دەبێتـە هـۆی نـەبوونی هاوسۆزی و تێگەیشتن لە پەیوەندییەکاندا.

پاڵنەرێکی بەردەوام بۆ سـەرکەوتن دەتـوانێت ببێتـە هـۆی پشتگوێخستنی کارامەیی کۆمەڵایەتی و پەیوەندی سـۆزداری. کـە لە ئەنجامـدا کێشـە لـە پەیوەنـدیکردن و هاوسـۆزی و ڕێکخسـتنی سۆزداریدا درووست دەبێت.

لە کۆتاییدا، دانانی سەرکەوتن بەسـەر هـەموو شـتێکدا لـە ژیاندا دەتـوانێت کاریگـەریی ناپێویسـت لەسـەر بـەهای ئاکـاری و خودی تاکێک هـەبێت. فشـاری سـەرکەوتن دەتـوانێت ببێتـە هـۆی ئەوەی تاکەکان بەرژەوەندییەکانی خۆیان بەسەر کەسانی دیکەدا بسـەپێنن. ئەمـەش دەبێتـە هـۆی بـەرپابوونی کۆمـەڵێک ڕەفتـاری

نائاكــاريی وەكــوو: درۆكــردن و فێڵكــردن و ئیســتغلالكردنی كەسانی دیكە.

لەبــەر ئــەوە، پێویســتە تاكێــك لــە ژیانــدا هاوســەنگییەك لــەنێوان پیشــە و ئامانجــەكانی و، پەیوەندییــە كۆمەڵایەتییــەكان و تەندرووســتی خــۆی بڕەخســێنێت. چونكــە ئــاڵوودەبوون بــە ســەركەوتن و پیشــەكانمان، وامــان لێ دەكــەن تــاكێكی نــەرێنی و ناهۆشیارمان لێ بەرهەم بێت.

سەرکەوتن کۆی ئەو هەوڵە بچووکانەیە کە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ دووبارە دەکرێنەوە.

- ڕۆبێرت کۆلییێر (Robert Collier)

# سەرچاوە و پەراوێزەکان

## [١] کەلتووری سەرکەوتن [Grind/Hustle Culture] :

ئاماژەیە بۆ ئەو جیهانبینینەی کە دەبێت تاکێک هەوڵێکی خەست و پەڕگیر بدات بۆ ئەوی سەرکەوتوو بێت لە پیشەکەیدا. زۆرجار ئەم سەرکەوتنە دەبێتە زیانگەیاندن بە ڕەهەندەکانی دیکەی تاکەکە: وەکوو تەندرووستی و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان.



ڕاپرسییەکی ساڵی ٢٠٢٢ کە لەلایەن کۆمپانیای دیلۆیت ( Deloitte ) و کۆمپانیای هەواڵگری شوێنی کارەوە ( Workplace Intelligence) دەری خستووە کە ٢١٠٠ کارمەند و کارگێڕی تێدا بەشداربوون، دەرکەوتووە کە هەم کارمەندان و هەم کارگێڕان ماندوو بوون لەم کارە بەردەوامانەیان کە دەبێتە هۆی زیانگەیاندن بە تەندرووستی جەستەیی و دەروونیشیان.

بڕوانە:

Steve Hatfield، Jen Fisher، Paul H. Silverglate - The C-suite's role in well-being - 22 June 2022 - Deloitte Articles

### [٢] ئۆنڵی-فانس [OnlyFans] :

تۆڕێکی کۆمەڵایەتییە کە تیایدا بەرکاربەران مانگانە بڕە پارەیەک دەدەن بە بەرهەم-هێنەرەکان و، ئەوانیش کاڵاکانیان پێشکەش دەکەن بەوانەی کە پارەکەیان ناردووە.

بەشێکی زۆری ئەم کاڵایانە بازرگانیکردنی جەستەییە.

وەکوو: فیلم و وێنەی ڕووتی جەستە.

شایەنی باسە ئەم پێگەیە و پێگە هاوشێوەکانی لە دوای بەربڵاوبوونی بازرگانیکردنی جەستەییەوە گەشەیان سەندووە و ڕوویان لە زیادبوونە.

## [٣] ڕاپەر [Rapper] :

لێرەدا گشتگیرییەکم کردووە بۆ گەیاندنی مەبەستەکەم. ئەگەرنا لە ڕاستیدا مەبەستم ئەو ڕاپ-بێژانەیە کە بەرهەمی نەرێنی پێشکەش بە کۆمەڵگا دەکەنەوە کە ڕاپەکانیان بە ڕاپی بێ-مۆڕاڵ و داوەشاو [Degenerate Rap] و ڕاپی ئەوتۆتوون [Autotune Rap] ناسراون.



**[٤] کەلتووری بیکە/سەرکەوتن - [Make It Culture] :**

هەمان واتای [١].

**[٥] کارکردنی لەڕادەبەدەر [Workaholism] :**

ئەم چەمکە بەکار دەهێندرێت بۆ ئەو تاکانەی لەڕادەبەدار کار دەکەن و ڕەهەندەکانی دیکەی ژیانیان دەکەنە قوربانی بۆ پیشەکەیان.



**[٦] کاره بێسوودەکان/بێماناکان - [Useless Jobs] :**

چەمکی "کاری بێ کەڵک" ڕێژەییە و بەپێی تاک و کۆمەڵگایەک دەگۆڕێت. بەڵام هەندێک کار هەن کە لە سەردەمی نوێدا ڕەخنەیان لێ گیراوە کە بە ناپێویست یان بەفیڕۆدەر ناسراون. ئەمانەی خوارەوە  هەندێک نموونەی سەرەکی ئەم پرسەن:

١. ئەستێرەکانی تۆڕە-کۆمەڵایەتییەکان [Social Media Influencers] :



له کاتێکدا هەندێک لە ئەستێرەکانی سۆشیال میدیا بابەتی بەنرخ پێشکەش دەکەن و دەتوانن کاریگەری ئەرێنی دروست بکەن ... بەڵام هەندێکی دیکە بنەمای تەمبەڵی و بەکاربەری و بەرخۆری بەرەوپێش دەبەن و بەشدار دەبن لە تاودان و بڵاوکردنەوەی پرسی ڕووکەشبوون و بابەتە ساختە و کاتییەکانی کولتووری مۆدێرن.

٢. یاریزانانی یارییە ئەلیکترۆنییەکان [Video Game Livestreamers]:



هەندێک تاک یاریکردنی ڤیدیۆیی بە شێوەیەکی پیشەیی بەکار دەهێنن و بژێوی ژیانیان پێ دابین دەکەن. لە کاتێکدا ڕەنگە ئەمە بۆ هەندێک کەس جێگەی سەرنج و سەرگەرمی بێت، بەڵام هەندێکی دیکە وەک بەفیڕۆدانی کات و سەرچاوە ماددییەکان ڕەچاوی ئەم پیشەیە دەکەن. وە بەشێکی زۆری لێکۆڵینەوە ئەکادیمییەکان، جەخت لەسەر بەفیڕۆدانی کات و یارییە ئەلیکترۆنییەکان دەکەنەوە ...

–

ئەمانە تەنها بەشێکی کەمن لە پیشە بە بێکەڵک ناسراوەکان لە کۆمەڵگای ئێستادا. بەڵام بە گشتی، یاسایەکی سادە هەیە بۆ ناسینەوەی پیشەیەکی گرینگ لەگەڵ پیشەیەکی بێسوود:

پیشەی بەسوود بە گشتی پێک هاتووە لە

**ئامانج و گۆڵ :** کە پێویستە لەبۆ کارکردنی ڕێکخراوێک یـان کۆمەڵگایـەک.. لـە بەرامبـەردا پیشـە بێ کەڵکـەکان هیچ ئامانجێکی ماناداریان نییە و زۆرجار هـەر تـەنها بـۆ سـەرگەرمی و خۆشی و شادی بەڕێوە دەبردرێن.

**کاریگەری :** پیشەی گرینگ، کاریگـەری بـەرچاوی لەسـەر ژیانی کەسانی دیکە و تاکەکانی دیکەی کۆمەڵگا هەیە. ئینجـا ئـەم کاریگەرییـە ڕاسـتەوخۆ بێت یـاخود ناڕاسـتەوخۆ. وە هـەروەها پیشـەی گرینـگ و بەسـوود، کاریگـەریی سـەرەکی لەسـەر سەرکەوتنی ڕێکخراو و جڤاکێک هەیە. بەڵام لە بەرامبەردا سەیر دەکەین کەوا پیشە بێسوودەکان ئەم کاریگەرییـەیان نییـە و سـیز بوونەتەوە.

**بەرکەوتـەی-کۆمەڵایـەتی :** پیشـە گرینگـەکان بەرکـەوتی زیاتریـان لەگـەڵ مرۆڤـەکانی دیکـەدا تێدا بـەدی دەکـرێت. بـەڵام پیشە بێسوودەکان تەنها خودین و جەخت لەسـەر خـودی تاکێک دەکەنەوە. وە بە گشتیش دژە-مرۆیی و دژە-کۆمەڵایەتین.

## [٧] سەرکەوتوو بە و بیکە گرینگ نییە ئامانجەکە چی دەبێت [Make It No Matter What] :

دەسـتەواژەی "بیکـە، ئەگـەرچی هەرچییـەک ڕوو بـدات" دەستەواژەیەکی پاڵنەرانەیە و دەفع-کارانەیـە. کـە هـانی تاکـەکان دەدات بـۆ بـەردەوامبوون و تێپەڕانـدنی بەربەسـتەکان یـان تەحەددییاتەکانیان.

لە هەمان کاتدا، ئەگەرچی لە ڕووی دەروونییەوە دەشێت ئەم دەستەواژەیە کاریگەرییەکی هێورکـەرەوە و ئیلهامبەخشـمان پێ بدات. بـەڵام لـە ڕووی مانـاوە دەبینین کـە چەنـدە نـەرێنی و

نامرۆڤانەیە. چونکە ئەم دەستەواژەیە داوامان لێ دەکات کە بگەین بە ئامانجەکانمان بە هەرچۆنێک بێت. لێرەدا کێشەکە ئەوەیە کە ئەم دەستەواژەیە ئەوە لەبەرچاو ناگرێت کە ئاخۆ ئەم ئامڕازانەی لەبۆ بەدەستهێنانی ئامانجێک بەکار دەهێندرێن شیاون یاخود نەخێر ...



**[٨] پەیوەندیداربوون – [Relatability] :**

چەمک و هاشتاگی [Relatable#] بە شێوەیەکی گشتی لە پلاتفۆرمەکان و تۆڕە-کۆمەڵایەتییەکانی وەکوو تویتەر [Twitter]، ئینستاگرام [Instagram] و تیک-تۆک [TikTok] بەکاردەهێنرێت بۆ وەسفکردنی بابەتێک کە هاوئەزموون و هاوپەیوەندە لەگەڵ ڕێژەیەکی زۆری مرۆڤەکانی دیکەدا. بۆوێنە: تاکێک گرتە-ڤیدیۆیی خۆی بڵاو دەکاتەوە کە باسی غەمەکانی دەکات. ئەم بابەتەی کە تاکەکە بڵاوی کردووەتەوە ڕیلەیتەبڵە. چونکە بەشێکی زۆر لە خەڵکی هاوئەزموون و هاوسۆزن لەگەڵ ئەم تاکەدا. لە سادەترین پێناسەیدا، ئەم هاشتاگە بەکاردێت بۆ دەربڕینی ئەزموونێک، هەستێک، یان دۆخێکی هاوبەش کە زۆر کەس تیایدا دەتوانن بەیەکەوە هاوخەمی و هاوئەزموونی لەگەڵدا دەرببڕن.




**[٩] سەرگەرمی – [Entertainment] :**

ئاماژەیە بۆ هەر چالاکیەک کە مەبەست لێی سەرقاڵکردن، دڵخۆشکردن، یان سەرگەرمکردن و ڕابواردن و کاتبەسەربردن بێت. ئەم چەمکە کۆمەڵێک چالاکیی بەرفراوان لەخۆ دەگرێت و کۆیان دەکاتەوە. وەکوو: سەیرکردنی فیلم، یاری ڤیدیۆیی، بەشداریکردن لە کۆنسێرتەکان یان بۆنەکان و

ئاهەنگەکان و کێبڕکێیەکان و بۆنە وەرزشییەکان، خوێندنەوەی کتێب، یان بەشداریکردن لە گەشتکردن و هیدیکە ...

بە گشتی هەر چالاکییەک کە خۆشی و چێژ دەربببڕێت دەکرێت بە سەرگەرمی لە قەڵەم بدرێت.



سەرکەوتن جێگرەوەی نییە.

- دۆگلاس ماکئارسەر (Douglas MacArthur)

... سەرکەوتن کۆی ئەو هەوڵە بچووکانەیە کە
ڕۆژ لە دوای ڕۆژ دووبارە دەکرێنەوە ...

